# بۆ خوشکێکی.....
# دەم بە ڕۆژووی لەچکە بەسەر
## لەم مانگەدا



**ئامادەکردنی**
**حەمزە بەرزنجی**

**لەڕێی خوادا دەبەخشرێو نافرۆشرێت**



بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشكەشە:

١- بە هەر خوشكێكی عاقڵ و بە فام كە بە دوای ڕاستیدا عەودالە.

٢- بەو دایك و باوكانەی چۆن بەیەنگ دونیای منالەكانیانەوەن ئاواش لەخەمی ڕەوشت و قیامەتیاندان.

٣- بە هەموو ئەو ئافرەتانەی لەم مانگە پیرۆزەدا سەلمانیان ڕێز لە دروشمە ئیسلامییەكان دەگرن.

# دەسپێك

ئافرەتان قوتابخانەی میللەتن، چاکی‌و خراپی هەر کۆمەڵگایەك بەندە بە ئاستی باشی‌و خراپی ئافرەتانەوە، چونکە ئەرکی پەروەردەکردنی وەچەیەکی مرۆڤ لە دەستی ئەوەندایە. جا ئەگەر ئەو قوتابخانە یە خۆی بۆخۆی پڕ بوو لە بەها جوانەکان‌و خەسڵەتە بەرزو پەسەندەکان، ئەوا نەوەکانیش بە جوانی ئەو ئاکارانە ئارایشت دەبن.

لە بەرئەوە گاورو جولەکەو ئەڵقە لەگوێکانیان هێندەی گرنگی دەدەن بە بواری ئافرەتان‌و راکێشانیان بەرەو زەلکاوی دونیا ویستی‌و چڵکاوی ئارەزوو بازی‌و لەخشتە بردنیان... هەرگیز بەنیو هێندە گرنگی نادەن بە رەگەزەکانی تر.. لەم پێناوەشدا سەرجەم هۆکارەکانی ئیغراو لەخشتە بردنیان رەگەزی سەرەکی بریتی بووە لە ئافرەتان.

ئەوەشی وایکردووە لەم پیلانەیاندا سەرکەوتووبن، خۆش بڕوایی‌و بەفیترەت پاکی‌و سینە ساف ئافرەتان بووە کە زۆر بە سانایی بەدەم بانگەوازەکانیانەوە

چوون‌و بونەتە نێچیری دەستەمۆی هەموو ئەو فیکرو بیردۆزە گومڕاو گومڕاکەرانە.

ئەوەتا یەکێ لەو گاورانە دەڵێ: (كأس وغانية يفعلان في أُمة محمد ما لا يفعله الآف المدافع).

واتە: قاپێك مەیی‌و ئافرەتێکی گۆرانی بێژ کاریگەرییەکی وایان هەیە لەسەر ئومەتی محەممەد (ﷺ) کە بەهەزاران تۆپ ناکرێت.

جا خوشکی بەڕێز... ئەی پەروەردیاری میللەتێك. چاك بزانە ئەو پیلانە نەخشە بۆ کێشراوە وردە درێژخایەنەی بۆ تۆ دانراوەو لەرێگەتدا چێنراوە زۆر لەوە سامناکترە کە لە یادی بکەیت‌و گوێ‌و چاوی خۆتی لەئاستا بنوقێنی.

پێویستە هەردەم بێداربیت‌و دۆست‌و دوژمنانت لەیەك جیا بکەیتەوەو بزانیت دەروون نەخۆشان تا هێندە تۆیان لەلا بەبایەخە تا ئارەزووە شەیتانیەکان لەسەر تۆ تێر دەکەن‌و پاشتر دەبیتە کالآیەکی رزیوی بێ بایەخ لەلایان، هەموو ئەو ووشە باق‌و بریقانەی رۆژانە کاوێژی دەکەنەوە: لە (مافی ئافرەت‌و ئازادی رەهاو نەهێشتنی باوك سالاری‌و شکاندنی کۆتی

کۆمەڵگا...وهتد)، جگە لە بەشێك لەو پیلانە ترسناکە چی تر نییە.

خوشکە خوشەویست و جوامێرەکەم... ئەی پاڵەوانی خۆڕاگر لە ئاستی هەموو ئەم شاڵاوە دڕندانانەدا: تۆ لە کۆمەڵگایەکدایت هێشتا بریسکەی رەوشتە بەرزو جوانەکانی ئیسلامەتی و کوردایەتی: لە شەرم و حەیا و داوێن پاکی تیایدا دەدرەوشێتەوە، سوپاس بۆ خوای گەورە بەسەدان باوەشێن و فوی دەم نەتوانراو ناتوانرێت ئەو بەهاو سەرمایە گەورە مان لەناوبەرن و بیکوژێننەوە.

تۆی ڕوسوور (لەخوشکان و دایکان)... لەم مانگە پڕ فەڕو پیرۆزییەی رەمەزاندا چەند جوانن... هێندەی تر خۆتان جوانتر کرد بەئاوی دەست نوێژو ویردی رۆژانەو زوبانی بەرۆژوتان. ئێوە مانگێگ لەپاڵەوانێتی و ئارامگرتنتان لەناو نامەی کردەوە جوانەکانتاندا تۆمار کرد.

ﷲ... چەند شیرینە دیمەنی ئەو هەموو ئافرەتە باڵا پۆشە بەهەیبەت و حورمەتەی لەبەر ترسی خوای

گەورە... خۆی کردە گوڵێکی ئەرخەوانیو خۆی لە زۆر حەزو ئارەزووی نەفسی گرتەوە.

منیش داوات لێدەکەم... وەك چۆن ئەم مانگە شەیتانەکانت خستە ژێرپێو توانیت زاڵ بیت بەسەر خۆتداو خۆت لەحەلاڵەکانی وەك (خواردنو خواردنەوە) گرتەوە. لەمەو دوا بەڵێن بدە بەخوای خۆتو دلێرانەتر.. جەسورانەتر ئەو کردەوە چاکانەی لەم مانگەدا ئەنجامتدا.. ئەو لەچکە بەویقارەی لەسەرت کرد داینەنێیتو وازی لێ نەهێنی.. چونکە چاك بزانە سوێند بەخوا بەوەوە جوانتری، بەڕێزتری، خۆشەویستری.

جا لەم کۆتایی مانگی رەمەزانەدا ، ئەم کۆمەڵە ئامۆژگارییەت بۆ دەکەمە دیاری، هیوادارم زۆر بەوردی بیخوێنیتەوەو زیاتر رێزو بەهای خۆت بۆ روون بێتەوەو لە سۆنگەی ئیسلامەو زیاترخۆت بناسیو لات ئاشکرا بێت کە ئەو بالاً پۆشییەی لەبەرتایە، ئەو تاجە بەرزەی لەسەرتایە چەندێك سەنگینو رەنگینە.

# بەهای ئافرەت لەنێوان بیری نەفامیو ڕێبازی ئیسلامییدا

لە وڵاتانی ڕۆژئاواو لە سایەی بیری نەفامی دەستکردا ساڵانە سەدان ئافرەت لەسەر جادەکاندا رەق دەبنەوەو لەسەرمادا گیان لەدەست دەدەن بەهۆی دووری لەخێزانو بێ بەهابوونیان لەلای کەسو کارو هاوسەریان، ئەویش بەهۆی پیریو چوونە ساڵەوە. چونکە ئەوان پێیان وایە ئافرەت ئەوەندە پێویستە تا گەنجەو توانای تێرکرنی ئارەزووەکانی پیاوی هەیە. وە دایکانیشیان کە پیر دەبن فڕێ دەدرێنە خانەی پیران (دار العجائز)و بێ بەش دەکرێن لە سۆزو بەزەیی دایکایەتی.

بەڵام لە سایەی ڕێبازە جوانەکەی خوای پەروەردگاردا دایك سێ جار مافی لە پێشترە بەسەر باوکدا، وەکاتێ دەگاتە تەمەنی پیری مافیان زیاد دەکات بەسەر نەوەکانیانەوە.

لە ئیسلامدا ئەو کاتەی پیر دەبنو دەچنە ساڵەوە دەبنە گوڵی ماڵو دەخرێنە سەرەوەی مەجلیسو بەبێ پرسو راوێژی ئەوان هیچ ناکرێت، منداڵان رادەهێنرێن

که به (داپیره گیان) ناویان بەرن‌و دەستیان ماچ بکەن‌و وەك باخی بۆن خۆش نەوەکانیان بەهرەمەند دەبن له بۆنی پەندو چیرۆکه نایابەکانیان.

ئافرەت لەلای بیری نەفامی له ژێرناوی سەربەستی‌و ئازادییەوە دەکرێتە کالاٌی دەستی چاو برسییان‌و داوێن پیسان‌و دەرون نەخۆشان‌و وەك پەشتەماڵی حەمام‌و قاپی چێشتخانەو پیاڵەی گازینۆکان هەردەمەو کەسێك گەمەی پێ دەکات، لەبەرئەوە له رۆژئاوادا زۆر ئاساییە که ئافرەتێکی گەنج چەند کوڕێك لەگەڵ خۆی دەباتەوەو دەچنە ژووری تایبەتی خۆی‌و دەمێننەوە!! ئەگەر باوکی پرسیاری کرد ئەوانەکێن لەگەڵت؟ ئەویش دەڵێ: (My friends) هاوڕێکانمە!!

ئەمەیە داڕمانی کۆمەڵگاو هەڵوەشانی شیرازەی خێزانەکان.

له راپرسییەکی گۆڤاری (L)ی ئەڵمانیدا هاتووە که لەسەر (١٠٠) ئافرەتی سەرو تەمەنی (١٤) ساڵی ئەنجامیداوە: که ٦٩٪ یان پەیوەندی سێکسی‌و خوشەویستییان لەگەڵ پیاوێکی تری جگه له هاوسەرەکانیان هەیە، وە ٢٥٪ یان پێشتر پەیوەندییان

**هەبووە لەگەڵ پیاوێکی تر. وە ٢١٪ یان لەگەڵ دوو پیاوی تری جگە لەهاوسەرەکانیان پەیوەندییان هەیەو ٣٪ یان پێیان وایە کە دەگونجێت لە یەك کاتداو بەئاشکرا لەگەڵ (٣) پیاودا پەیوەندییان هەبێت.!!!!**

**ئافرەت لە سایەی بیردۆزە نەفامییەکاندا کاڵایەکی بێ بەهایە.. ریکلامی سەر زۆرێك لە بەرووبوومە بازرگانیەکانە: سابوون، تایت، خواردەمەنیەکان..**

**وەك (داهۆڵ)ێك دەخرێتە کۆگانەوە بۆ رەواج دان بەشتو مەکەکانیان. وە بۆ بازاڕدان بەگۆرانیەکانیان، بەناو هونەرمەندەکان بە چەندان شێوە ئافرەتانی سۆزانیو سەماکار دەکەن بە کلیپی بەرهەمەکانیانو بەدەرخستنی لاشەی هەرزانیان سەرنجی بینەران رادەکێشن، کام کلیپ زیاتر لاشەی ئافرەتانی تێدا دەردەکەوێت ئەوەیان زیاتر مەرغوبترەو زیاتر سەرف دەبێت.**

**لە رێبازی جوانی خواییدا لەپشت هەموو قارەمانێکی هەڵکەوتووەوە ئافرەتێکی سەربازی ون هەبووە کە بۆتە هۆی پێگەیاندنو پەروەردەکردنی. لە ناو ژیاننامەی پێغەمبەراندا چەندان کەڵەئافرەت بەرچاودەکەون لە**

نمونەیان دایکی موسا (علیه الصلاة والسلام)، مەریەمی پاکداوێنی دایکی عیسا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، هاجەرەی دایکی ئیسماعیل (علیه الصلاة والسلام)و چەندانی تر.

خوشکی خۆشەویستم... لەئیسلامدا ئێوە ریزی پێشەوەی کاروانی بانگەوازو شەهادەتتان گرتووە: یەکەم کەس ئیمانی هێنا بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) خەدیجە (رضي الله عنها) بوو، وە یەکەم شەهید (سومەییە)ی دایکی عەمماری کوڕی یاسر بووە(رضي الله عنها).

سەدان نمونەی ئازایی و گیانفیداکاریی و بوێری لە لاپەڕەکانی مێژووی ئیسلامییدا ئافرەتان ئەکتەری بوون، لە نمونەی: ئەسمائی کچی ئەبو بەکرو زەینەبی کچی جەحش و نوسەیبەی کچی کەعب و سەدانی تر....

بەڵام لەسایەی بیردۆزە نەفامییەکاندا جگە لە ئافرەتانی بێ شەرم و شکۆ و شۆڕاوە لە بەها جوانەکانی نا و کۆمەڵگا چی تر بەدی ناکرێت... چونکە: خۆ رووت کردنەوە.. ئیغراکردنی گەنجان.. لەش فرۆشی.. گۆرانی و سەما... دروشم و بەرنامەو ئامانجیانە.

## دیاردەی سفوری لەناو ئافرەتاندا

یەکێك لەو دیاردە زەقو نامۆیانەی لە وڵاتانی موسڵماناندا بەدی دەکرێت: خۆڕووتکردنەوەو لاشەی خۆ دەرخستنی ئافرەتانە بۆ کەسانی بێگانە، وەچوونە دەرەوەیانە لەماڵ بەشێوەیەکی سەرنج راکێش و بۆنی خۆشدان لەخۆ .

دەبا سەرنجێك بدەینە قورئان و بزانین ئیسلام چی دەڵێت سەبارەت بە جل و بەرگ و پۆشاکی ئافرەتان:
خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ قل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم ويحفظوا فروجهم ذلك أزكى لهم ان الله خبير بما يصنعون. وقل للمؤمنات يغضضن من أبصارهن ويحفظن فروجهن ولا يبدين زينتهن الاً ما ظهر منها وليضربن بخمرهن على جيوبهن ولا يبدين زينتهن الا لبعولتهن أو آبآءهن أو آبآء بعولتهن أو أبناءهن أو أبناء بعولتهن أو اخوانهن أو بني اخوانهن أو بني أخواتهن أو نسآءهن أو ما ملكت أيمانهن أو التابعين غير أولي الاربة من الرجال أو الطفل الذين لم يظهروا على عورات النسآء ولا يضربن بأرجلهن ليعلم ما يخفين من زينتهن وتوبوا الى الله جميعاً أيها المؤمنون لعلكم تفلحون﴾. **النور/٣٠-٣١**

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا بە بڕوادارانی نێر بڵێ کە لە ڕوانینی چاوەکانیان بگرنەوەو داوێنیان بپارێزن، ئا ئەوە چاکترو پاکترە بۆیان، بێگومان خوای گەورە شارەزایە بەوەی کە ئەنجامی دەدەن، وە بە ئافرەتانی بڕوادار بڵێ با لە ڕووانینی چاوەکانیان بگرنەوەو داوێنیان بپارێزن، وە با جوانی خۆیان –جگە لەوەی کە دەردەکەوێت– وەدەرنەخەن، وە با بە سەرپۆشەکانیان یەخەو بەرۆکیان داپۆشن، وە با جوانی خۆیان دەرنەخەن مەگەر بۆ مێردەکانیان یان باوکانیان یان باوکانی مێردەکانیان یان کوڕەکانیان یان کوڕانی مێردەکانیان یان براکانیان یان کوڕانی براکانیان یان کوڕانی خوشکەکانیان یان ئافرەتانیان یان کەنیزەك و کۆیلەکانیان یان پیاوانێکی بەردەست کە تەماعیان لە ژندا نیيە، یان مندالأنێك کە عەقڵیان بە عەورەتی ژن ناشکێ، وە با ئافرەتان لاقی خۆیان بە زەویدا نەکوتن بۆ ئەوەی خشڵێك کە پەنهانیان کردووە پێی بزانرێ، وە

تێکڕا هەمووتان بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە ئەی بڕوادارینە بەڵکو سەرفراز ببن.

لە سورەتێکی تردا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:﴿ يآ أيها النبي قل لأزواجك وبناتك ونسآء المؤمنين يدنين عليهن من جلابيبهن ذلك أدنى أن يعرفن فلا يؤذين وكان الله غفوراً رحيماً ﴾.الأحزاب/٥٩.

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا بە خێزانەکانت و کچەکانت و ئافرەتانی بڕواداران بڵێ کە چارشێوەکانیان لە خۆیانەوە بپێچن، ئا ئەوە چاکترە بۆ ئەوەی بناسرێن ( کە خاوەن حەیاو حورمەتن)و (بەهۆی تەماع تێکرانەوە) ئازار نەدرێن، وە خوای گەورە لێبوردەی بە بەزەییە.

جارێکی تر بە خێزانە بەحەیاو بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:﴿ يآ نساء النبي لستن كأحد من النسآء ان اتقيتن فلا تخضعن بالقول فيطمع الذي في قلبه مرض وقلن قولاً معروفاً. وقرن في بيوتكن ولاتبرجن تبرج الجاهلية الأولى وأقمن الصلاة وآتين الزكاة وأطعن الله ورسوله انما يريد الله

ليذهب عنكم الرجس أهل البيت ويطهركم تطهيراً ﴾. الأحزاب ٣٢-٣٣

واتە: ئەی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ئێوە ئەگەر خواناس بن (لە فەزڵدا) وەك هیچ ئافرەتێکی تر نین، دەسا دەنگتان ناسك مەکەنەوە نەبا ئەو کەسەی دڵیی نەخۆشی دەغەڵی تێدایە تەماعتان پیٚ ببات، وە ووتەی چاك و باش بڵێن. وەلە ماڵەکانتاندا بمێننەوەو وەك خۆدەرخستنی ئافرەتانی سەردەمی نەفامی خۆتان دەرمەخەن . وەنوێژ بەرپا بکەن و زەکات بدەن و گویٚڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن. بە ڕاستی ئەی ئەهلی بەیت خوای گەورە ئەیەوێت پیسیو تاوانتان لیٚ دوور بخاتەوەو پاکتان بکاتەوە بە پاك کردنەوە.

جا لە تەفسیری ئەم دوو ئایەتەدا ئیبن کەثیر (ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) دەفەرموێت:( هذا آداب أمر الله تعالى بها نسآء النبي (ﷺ) ونسآء الأمة تبع لهن في ذلك...). تفسير القرآن العظيم ٣/٤٢٢.

واتە: ئەمە کۆمەڵە ئادابێکە خوای گەورە فەرمانی کردووە بە خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، وە خێزانی پیاوانی ئەم ئوممەتەش لەمەدا شوێنکەوتەن و ئەوانیش دەگرێتەوە.

بەڵام بێ ئاگا لەم ئایەتانەو چەندان فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، زۆرێك لە ئافرەتان لەم ڕۆژگارەدا لاشەو جەستەی خۆیان کردۆتە کاڵایەکی هەرزان و بێ باکانە نیشانی خەڵکی دەدەن کە ئەمەش یەکێکە لەنیشانەکانی ئاخر زەمان و قیامەت.

عن عبدالله بن عمرو (رضي الله عنهما)مرفوعاً:( **سيكون في آخر اُمتي نسآء كاسيات عاريات، على رؤوسهن كأسنمة البخت، العنوهن فانهن ملعونات** ).أخرجه الطبراني في المعجم الصغير ص ٢٣٢، وقال الالباني في حجاب المرأة المسلمة ص ٥٦: اسناده صحيح.

واتە: لەکۆتایی ئوممەتەکەمدا ئافرەتانێکی پۆشتەی رووت پەیدا دەبن. قژیان وەکو کۆپاری سەرپشتی حوشتر لێ دەکەن، جا نەفرەتیان لێ بکەن ئەوانە نەفرەت لێکراون.

جا ئەبێ ئەم تاوانە چەندێك گەورەبێت تا بگاتە ئەو ئاستەی شایستەی نەفرەت لێکردن بێت.

وه ئەو جۆره كەسانە لەوانەن كە بۆنی بەهەشت ناكەن:-

**عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): (صنفان من أهل النار لم أرهما: قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس، ونسآء كاسيات عاريات مميلات مائلات، رؤوسهن كأسنمة البخت المائلة، لايدخلن الجنة ولايجدن ريحها، وإن ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا)**. رواه مسلم في صحيحه (١٧/١٩٠- بشرح النووي).

واتە: دوو كۆمەڵە كەس هەن لە ئەهلی ئاگرن و نەمدیون: كۆمەڵێكیان كەسانێكن قامچییان پێیە لە وێنەی كلكی مانگا لە خەڵكی پیٚ دەدەن، وە ئافرەتانێكی پۆشتەی رووتی لادەر لە گوێرایەڵی خوای گەورەو رەوشت، كە بەلارو لانجە دەڕۆن بەڕێدا. قژیان وەك كۆپارەی لاربووەوەی سەرپشتی حوشتر لیٚ دەكەن (بەوەی قژیان كۆ دەكەنەوەو لەلایەكی سەریاندا گرێی دەدەن)، ئەمانە ناچنە بەهەشتەوەو بۆنیشی ناكەن، لەكاتێكدا بۆنی بەهەشت لە دووری ئەوەندەو ئەوەندەوە دەكریٚ..

سەرنج بدە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) مرۆڤی ستەمکاری ئازاردەری خەڵکی لەگەڵ ئافرەتێکی پۆشتەی رووتدا بەیەکەوە ناوبردووە.

جا (**پۆشتەن**) بەومانایەی: پۆشاکیان لە بەردایەو بەڵام (**رووتن**) بەوەی: پۆشاکەکانیان ئەرکی داپۆشینی لاشە بەجێ ناهێنێت، بەوپێیەی تەنکە یان تەسکەو ئەندامەکانی لاشەی لێوە دیارە، یان هەندێك لە لاشەی دەردەخات‌و هەندێکی تری داپۆشیوە. وەك ئەوەی لەم مانگەدا بەدی دەکرێت: لەچکۆڵەیەکی کردووە کەچی بەشی خوارەوەی جەستەی جل‌و بەرگەکانی تەسك‌و تەنك‌و کورتە.

ئەو جۆرە ئافرەتانەی لاشەی خۆیان دەردەخەن‌و هەست بە تاوان‌و سەرپێچی ناکەن بگرە زۆر بە کەشخەیی‌و فیزەوە دەڕۆن بەڕێدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە مونافیق ناوزەدی کردوون:

**عن ابي ذنبة الصدفي مرفوعاً: (خير نسآءكم الودود الولود.... وشر نسآءكم المتبرجات المتخيلات، وهن المنافقات، لايدخل الجنة منهن إلى مثل الغراب الأعصم)**، أخرجه البيهقي في

السنن الكبرى ٨٢/٧ وقال الالباني في السلسلة الصحيحة (١٨٤٩): حديث صحيح.

**واته: چاكترين ئافرەتانی ناو ئێوه ئەوانەیانن كه خۆشەویستن لەلای مێردەكانیان‌و وەچەو منداڵ دەخەنەوه.... وەخراپترینی ئافرەتانیشتان ئەوانەیانن كه لاشەی خۆیان دەردەخەن‌و به فیزو خۆ بەزلزانن. ئەوانه مونافیقن لێیان ناچێته بەهەشتەوه تەنها بەئەندازەی قەلەرەشی باڵ سپی نەبێت.**

**شێوازێكی تری سیمای ئافرەتانی پۆشتەی رووت بریتییه له پۆشینی بەرگ‌و پۆشاكی پیاوانه لەلایەن هەندێك ئافرەتەوه، وەك لەبەركردنی پانتۆڵ‌و بلوسی پیاوانەو قژبڕین‌و كورتكردنەوەو داهێنانی بەشێوەیەك كه سیمای مێینەیی خۆیان له دەست دەدەن، سەرباری ئەوەی كه ئەندامەكانی جەستەیان دەردەكەوێت.جا ئەم جۆره كارانەش له سیفاتی ئەهلی دۆزەخیانه:**

**عن إبن عمر (رضي الله عنهما) مرفوعاً: (ثلاث لايدخلون الجنة: العاق لوالديه، والديوث، ورجلة النسآء).** رواه في المستدرك ٧٢/١ والطبراني في مجمع الزوائد ٣٢٧/٤ بسند قال المنذري: لا أعلم فيه مجروحاً قريب منه.

واتە: سێ کۆمەڵ هەن ناچنە بەهەشتەوە: ئەو کەسەی ئازاری دایكو باوکی دەدات، وەپیاوی گەوواد (ئەو پیاوەی رازییە بە خراپەو داوێن پیسی لەناو خێزانەکەی)، وە ئەو ئافرەتەی خۆی دەخاتە سەر شێوەی پیاوان.

هەروەك چۆن بە پێچەوانەشەوە زۆر کوڕی گەنج هەن شێوەو قسەو ڕۆشتنو سیمایی خۆیان وەك ئافرەت لێ دەکەن، ئەمانیش بەر هەڕەشەی گەورە دەکەون:

**عن إبن عباس (رضي الله عنهما) قال: (أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) لعن المخنثين من الرجال و المتبرجات من النسآء)**. اخرجه النسائي في السنن الكبرى رقم (٩٢٥١).

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەفرەتی کردووە لەو پیاوانەی خۆیان دەشوبهێنن بە ئافرەتانو ئەو ئافرەتانەی کە لاشەی خۆیان دەردەخەن.

لە هەمووی سەیرتر دەرکەوتنی ئافرەتانی گۆرانی بێژو سەماکەری کوردیو لە کۆمەڵگای موسڵمانی خۆماندا، وە بەئاسایی تەماشاکردنی ئەم دیاردەیەیە لەلایەن خەڵکانەوە، بەجۆرێك کەناڵە ناوخۆییو ئاسمانییەکانی کورد زۆر بەشانازییەوە پەخشی دەکەن.

**عن سهل بن سعد أن رسول الله (ﷺ) قال: (سيكون في آخر الزمان خسف وقذف ومسخ. قيل: ومتى ذلك يا رسول الله؟ قال: إذا ظهرت المعازف و القينات).** رواه الطبراني. قال الالباني: صحيح. أُنظر صحيح الجامع الصغير ٢١٦/٣ رقم (٣٥٥٩).

**واتە: لەئاخر زەماندا دیاردەی رۆچوونی زەوی‌و بەردبارین‌و گۆڕانی دڵ‌و دەروونی خەڵك** (بۆ سەر **تەبیعەتی گیانلەبەرانی وەك مەیمون‌و بەراز) روودەدات، وتیان: ئەوەچ کاتێ پەیدا دەبێ ئەی پێغەمبەری خوا** (ﷺ)**؟ فەرمووی: کاتێك کە ئامێرەکانی مۆسیقاو گۆرانی بێژان دەربکەون بەتایبەتی گۆرانی بێژی ئافرەت.**

(سبحان الله)**!! ئەم دوو دیاردەیەو نیشانەی قیامەت ئێستا لەناویدا دەژین‌و بەچاوی خۆمان راستی ئەم فەرموودانە دەبینین.**

**ئەوەتا لە هەواڵەکاندا دیاردەی رۆچوونی زەوی روون‌و ئاشکرایە، وە دڵ‌و دەروونی خەڵك بەجۆرێك گۆڕاوە... دڵ رەقی، سپڵەیی، بێ شعوری، تەبیعەتی ئاژەڵی لەناو کۆمەڵگاکاندا روو لەزیاد بوونە.**

جا خوشكی سەر بەرزم.... سوپاسی خوای گەورەی دەوێت كە تۆ دووریت لەم جۆرە ئافرەتانەو هاوشێوەیان.

## هۆكارەكانی دەركەوتنی سفوری لە كۆمەڵگادا

١. ئیمان لاوازی: ئەویش بەهۆی زاڵ بوونی دونیا ویستی و شوێن كەوتنی هەواو ئارەزوو، وە دووركەوتنەوە لە قورئان خوێندن و نزاو پاڕانەوەو عیبادەتەكان بەگشتی.

٢. لاوازی پەروەردەی ئیسلامیی لەناو خێزانەكان و قوتابخانەو خوێندنگاكانداو زاڵ بوونی بیرو بۆچوونی تر، وە ون بوونی رەوشتە بەرزەكانی وەك: شەرمو حەیا، چونكە مرۆڤ كە شەرمی نەكرد هەرچییەك بكات پرسیاری لیٚ ناكرێت.

**قال رسول الله (ﷺ): (ثلاث لاتسأل عنهم: ......... وامرأة غاب عنها زوجها وقد كفاها مؤنة الدنيا فتبرجت بعده).** رواه البخارى في الأدب المفرد (٥٩٠) والحاكم وأحمد وصححه الالباني (صحيح الجامع ٣٠٥٨).

واتە: سێ جۆرە کەس هەن پرسیاریان لێ ناکرێت بۆ وا دەکەن (چونکە پەردەی حەیاو شەرمو شکۆیان دڕاندووە): ..... لەو سیانە یەکێکیان: ئافرەتێکە مێردەکەی لە سەفەر بێتو ئاگای لێی نەبێت، وەماڵ پێویستی دونیاشی بۆ فەراهەم هێنابێ، کە چی ئەم ئافرەتە لاشەو جوانییەکان (زینة)ی خۆی دەربخات بۆ بێگانە.

ئەی دەبێت حاڵی ئافرەتانێك چۆن بێت کە بە بەرچاوی باوكو براو مێردەکانیانەوە خۆیان رووت دەکەنەوە. یاخود حاڵی ئەو پیاوانە چۆن بێت کە ئافرەتەکانیان بوون بە مەیمونی ماڵەوەو ئاسکی دەرەوە، وە لەگەڵ خۆیاندا دەیانگێڕن بە بازاڕو شوێنە تێکەڵاوییە پڕ لە تاوانەکانو بەنیوە رووتی دەیانخەنە بەردەمی پیاوانی بێگانە.

زۆر بەداخەوە کە ئافرەتان بەجۆرێك سووك بکرێن کە لەکاتی زەماوەندیاندا بەرگێکی تەسکی تەنکیان لەبەر بکرێتو وەك بووکە بەبارانە بکرێنە پەندی ناوخەڵك. یان زۆر زاوا لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا وێنە دەگرنو

لەجامخانەی دووکانی وێنەگرەکاندا هەڵبواسریٚو خەڵکی سەیری ناموسیان بکات.

٣. تەقلیدو چاولێکەری کوێرانە: بەتایبەتی لەناو رەگەزی ئافرەتاندا، بەجۆرێك کەسێك لەگەڵ (مۆد) دا نەڕوات بەنامۆی دەزانن. وەهەر جلو بەرگێکی نویٚ لەسەر تەلەفزیۆنەکانەوە دەرکەوێتو لەبەری ئەکتەرێکی بیٚ ڕەوشتی رۆژئاوادا ببینریٚ خێرا لێرە لاسایی دەکرێتەوەو دەخرێتە بازاڕ.

٤. ونبوونی فەرمان کردن بەچاکەو بەرگری کردن لە خراپەو رەخنە گرتن لەم دیاردانە: بەجۆریٚ زۆر بە دەگمەن کەسێك سەرزەنشتی ئەو ئافرەتانەی ناو خێزانەکەی دەکاتو ئاگاداریان دەکاتەوە لەسەرئەنجامو سزای ئەم تاوانە.

٥. نەبوونی زانستی شەرعیو بیٚ ئاگایی لەو دەقانەی باس لە رادەی تاوانو سزای ئەم تاوانە دەکەن لە قیامەتدا.

٦. ترسانی ئافرەتان لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە لە پێناو نەهێشتنی سیمای ئیسلامیی کۆمەڵگاو چەسپاندنی بەرنامەی عەلمانییەتی لادینی لەوڵاتدا.

٧. **پیلانی شەوو رۆژی بێ دینان: لەهێنانەوەی جل‌و بەرگ‌و سیماو خوڕەوشتی رۆژئاوایی‌و نیشاندانی فیلم‌و گۆرانی رەوشت رووشێنەر لە راگەیاندنەکانیاندا وەمراندنی غیرەتی پیاوەتی لە پیاوانداو گومڕاکردن‌و بەنج کردنی گەنجان بە دەیان گۆڤارو رۆژنامەی بانگەوازکەر بۆ ئەم مەبەستەو سانسۆر خستنە سەر بالاپۆشان لەقوتابخانەو فەرمانگەکانداو تەماشاکردنیان بە چاوێکی سووک‌و مرۆڤی پلە دوو، وە تەعین نەکردنیان‌و کارئاسانی بۆ نەکردنیان.**

## ئەو دەرئە نجامانەی لە سفورییەوە دەکەوێتەوە

١. **جولاندنی غەریزەی کوڕان‌و پیاوان‌و پالنانیان بەرەو بەتالْ کردنەوەی ئەم غەریزەیە لە خراپەدا. هەر بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمویت: (ماترکت بعدي فتنة أضر على الرجال من النسآء).** رواه البخاری ٣٦١/٣ برقم (٥٠٩٦) واللفظ له ومسلم برقم ٩٧-٧٤٠.

واتە: لە پاش خۆم هیچ تاقی کردنەوەیەکم بەجێ نەهێشتووە قورسترو زەرەرمەندتر بێت لەسەر پیاوان لە (ئافرەتان).

٢. سفوری سەرکەشییەکی ئاشکرایە بۆ فەرمانەکانی خوای گەورەو ئەنجامەکەشی سەرشۆڕیو بێ ڕێزی دونیاو خەجاڵەتیو سزای قیامەتی بەدواوەیە.

٣. سفوری هۆکارێکی ڕاستەخۆیە بۆ توشبوونی گەنجان بە نەزەرو ئەو دەرئەنجامانەی لە نەزەرەوە دەکەوێتەوە لە: نەخۆشییە دەروونییەکانی گەنجان بەوەی تووشی دەردی عەشق بووە. وەزیناو ....هتد

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:( **كل عين زانية . والمرأة اذا استعطرت فمرت بالمجلس فهي كذا وكذا – يعني زانية)**. رواه الترمذي ٥ / ٩٨ – ٩٩ برقم (٢٧٨٦) وقال: هذا حديث حسن صحيح. والنسائي، وقال الالباني: حسن. صحيح سنن الترمذي برقم (٢٢٣٧ – ٢٩٤٩).

واتە: هەموو چاوێك زینا دەكات (نەزەر)، وەئافرەت ئەگەر بۆنی خۆش لە خۆی بداتو بەلای مەجلیسێکدا بڕوات ئەوە ئاواو ئاوایە (واتە زینای لێکراوە – بەو

**مانایەی: خەڵك بەحەرامی تەماشایان کردووەو حەزیان کردووە خراپەی لەگەڵدا بکەن).**

**٤. سفوری یەکێکە لەدیاردەکانی سەردەمی نەفامی. خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿....ولا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الجاهِلِيّةِ الأُولى.....﴾. **الأحزاب /٣٣.**

**واتە: لاشەو جوانی شاراوەی خۆتان دەرمەخەن وەکو سەردەمی نەفامی دەیانکرد.**

## مەرجەکانی پۆشاکی ئافرەتی موسڵمان

**خوشکی خۆم ...ئەو بەرگ و پۆشاکەی لەبەری دەکەیت پێویستە چەند خاڵێکی تێدا ڕەچاو بکەیت و چەند مەرجێکی تێدا بێتە دی (وەك زانایان بە درێژی باسیان لێوە کردووە)، نەك بە شێوەی مۆدێك –وەك لای هەندێك ئافرەت باوە– تەنها لەچکێك لەسەر دەکات کە نیوەی سەری داپۆشیوەو بەرگ وپۆشاکی لاشەشی لە بەرگی موسڵمان ناچێت. جا ئەو مەرجانەش ئەمانەن:**

١- دەبێت سەراپای جەستەی داپۆشێت جگە لە دەم وچاوو هەردوو دەستەکانی تا مەچەکەکان.

٢- نابێت پۆشاکەکە زریق و بریق و سەرنج ڕاکێش بێت.

٣- نابێت ئەو پۆشاکە تەنك بێت و پێستی لێوە بەدەر بکەوێت.

٤- نابێت تەسك بێت و قەبارەو شێوەی لاشەی دیار بخات.

٥- نابێت ئەو پۆشاکە لە هی پیاوان بچێت، چ جای ئەوەی بەرگی پیاو بێت.

٦- نابێت لە هی کافران بچێت.

٧-نابێت شۆرەتی پێ دەربکات ئەوەندە گرانبەها بێت.

## لەكۆتـايدا

خوشكى بەويقارو سەربەرز.... ئێستا بۆت روون بوويەوە لاشەى خۆدەرخستن سيماى نەفامانو دەرون بەزيوانە. زانيت سزاى ئەم تاوانە چەندێك سەختە... ئينجا دڵنيا بوويت لەوەى خۆداپۆشين تەوجيهى هيچ لايەن و ڕێكخراوێك نىيە ، بەڵكو فەرمانى بەديهێنەرى بوونەوەرە.....

بيربكەرەوە هەرچەند لاشەت ناسكو جوانو سەرنج راكێش بێت، لەگەڵ مردن گەشتە سەرتو چەند كاتژمێرێك بەسەرتا تێپەڕى.. كەس ناوێرێ نزيكت بكەوێتو تەماشات بكات.. دواى چەند رۆژێك گۆشتى ناسكو پێستى سپيت تێكەڵ بە كرمو مارو مێروو دەبن.. ئيتر چ فيترەتێكى شێواوە كەسێك بۆ چەند رۆژێكى كەمى دونيا سزاى سەختى هەتا هەتايى توشى خۆى بكات..

خوشكى بەڕێزم... ئەگەر لەدونيادا دامەزراوو بەردەوام بيت لەسەر خۆداپۆشينو عيبادەتەكانت.. ئەوا لە قيامەتدا لە حۆرييە چاو رەشەكان جوانترى.. بەڵكو دەكرێيتە پێشەواو لێپرسراوى حۆريەكانى

هاوسەرەکەت. دەبا دەرخستنی جوانیەکانت تەنها بۆ هاوسەرەکەت بێت، نەك خەڵکانی بێگانە.

جوانی تۆ بە دەرخستنی قاچو دەستو بەرۆکتەوە نییە. ئەگەر وابوایە دەبوو گیان لەبەران لە مرۆڤ جوانتر بوونایە. خۆ ئەوان هەموو لاشەیان بەدەرەوەیە..

سەر پۆشو لەچك لە پۆشاکی ئافرەتانی ناو بەهەشتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:(**....ولو اطلعت امرأة من نساء أهل الجنة إلى الأرض لملأت ما بينهما ريحاً، ولأضاءت مابينهما، ولنصيفها على رأسها خير من الدنيا وما فيها**). رواه البخاري (٦/١٥فتح).

واتە: ئەگەر ئافرەتێك لەحۆریەکانی بەهەشت تەماشایەکی زەوی بکات، پڕی دەکات لە بۆنی خۆشو ڕووناکی دەکاتەوە. وە سەرپۆشەکەی سەری چاکترە لەدونیاو لەوەش لە دونیادایە.



<u>سەر پۆش</u>

بـێـزار مەبە خـوشـکی بە ڕێز
لە تە شەری بێ بڕوایان.....
سەرپۆشەکەت قەڵغانێکـە
ڕاوەستاوە ڕوو بەڕوویان ...
نەت بیستووە کە پێغەمبـەر(ﷺ)
لە سەر خوشکێکی وەکو تـۆ
چی کرد بەدەستەی کافران...
ئەمڕۆش سیمای من وتۆیە
لە جێی هەزاران خەمی شار
بۆتە گرفت لە بەردەمـیان...!!!
داویـن پاکـی و حـەیاو شەرم
بـووە بە بەربەست و خـەمـیان
دەسا خوشکێ دڵنیابە سەرپۆشەکەت
لە تاجی سەری شاکانیان بڵندترە...
ئەو کاروانەی تۆ گرتوتە ...بۆ داهاتوو
ڕێی هـەزاران خـوشکی تـرە

پشتیوا بەرزنجی

زنجیرەی پەروەردەیی:

١- سوودەکانی هاورێیەتی پیاوچاکان.

٢- بلاوبوونەوەی داوێن پیسی..هۆکارو چارەسەر.

٣- دیاردەی مەی خواردنەوە لە ناو گەنجاندا.

٤- دامەزراوی.

٥- زمانت بە یادی خوای گەورە پاراو بکە.

٦- نوێژی جەماعەت و هامشۆکردنی مزگەوت.

٧- بۆ خوشکێکی لەچکە بەسەر لەم مانگەدا.

٨- تاقی کردنەوەی خوای گەورە حەتمییە.

٩- دیاردەی ساردبوونەوە لە دین.

١٠- پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) وەك ئەوەی ببیبینی